# حەلەب ..

# شكان وژێركەوتنە یا قارەمانێتی وسەركەوتن ؟

-مصطفى البدري

و: عبد الحق هەولێری

لە یارییە ئەلكترۆنییەكاندا (گەیمس games) ئاشنای بیرۆكەی ئاست یاخود بەرز بوونەوە ئەبین، یاریزان لە ئاستی یەكەمەوە - كە ئاسانترینیانە - دەست پێدەكات‌و وپاشان دووەمیان كە قورسترە، ئەگەر گەیشتە ئاستی سێیەم دیارە كە یاریزانێكی لێزان وپێشكەوتووە، هەتاكو ئەگەر لە كۆتاییشدا ئەو ئاستە تێنەپەڕێنی، چونكە ئێستا لە قورسترین قۆناغدایەو خەڵاتەكەی لە دوای تێپەڕاندنی ئەو قۆناغەوە دێ.

لە جەنگیشدا تا ڕادەیەك بەو شێوازە مامەڵە لەگەڵ زلهێزەكان دەكرێ، كە تاقیكردنەوەی سوپا تازەكانەو وهێنانیانە نێو ئەم یارییە ئاست ئاستەیە، تاوەكو تواناو وهێزەكانیان بە شێوەیەكی ورد دیاری بكرێن.

لە سووریا دا بە گشتی وبە تایبەتی لە حەلەب؛ ئەو كۆمەڵە موجاهیدە بە شارەزایی كەمی خۆیان وتوانای سنووردرایان جگە لە ژمارەی كەمیانەوە چوونە نێو مەیدانی شەڕێكی لاسەنگەوە لەگەڵ سوپای سووری نیزامی دا، لەگەڵ هەموو ئەمە سوپایان شكاند، ئەوجار زلهێزەكانی ناوچەكە (ئێران) بە خیبرەت وپسپۆڕی سوپای پاسداران وهاوشان لەگەڵ هێزی دەستە ڕاستی بە قوەتی خۆی (حزب الله ــــ لوبنانی) بە كۆمەكی میلیشیا

عێراقی وئەفغانییە شیعەکان هاتنە نێو شەڕەکەوە، بە هەموو ئەو توانایانە نەیانتوانی سەرکەوتنێکی وا بەرچاو بەرامبەر موجاهیدە قارەمانەکانی حەلەب بە دەست بێنن.

لێرەدا هیچ ڕێگەچارەیەکی تر جگە لە بەشدار بوون لەو شەڕەدا لە بەردەم زلهێزە جیهانییەکان دا نەما، ئەوە بوو ڕووسیا لە ٣٠ سێپتەمبەری ٢٠١٥ هاتنی خۆی بۆ ڕزگارکردنی سوپای سووری لە حەلەب دا ڕاگەیاند، کە شتی واش ڕوو دەدا دیارە کە ئەمریکا لە پێشدا چرای سەوزی خۆی بۆ هەڵکردووە. بەڵکو جیا لەوەش؛ بەشداری کردنی خودی ئەمریکا ودەست وەردانی لە شەڕەکە بەرامبەر بە موجاهیدان لە لای هەمووودا دیار وئاشکرایە، بەڵام بە شێوازێکی جیاواز لە شێوازی ڕووسەکان، ئەو ڕاگەیاندنەی ڕووسیاش لە ڕاستیدا ڕاگەیاندنی سەرکەوتنی موجاهیدانی حەلەب بوو کە خەریکی شەڕێك بوون بە کۆمەکی گەلێکی بەستەزمانی هەژارەوە کە بە درێژەی پێنج ساڵە لە ژێر باری هەژاری ونەداری دا دەناڵێنن، ئەو موجاهیدانەی بە بڕیاری نێودەوڵەتییەوە ڕێگەی ئەوەیان لێ گیراوە خاوەنی چەکی دژە زرێپۆش بن جگە لە چەکی دژ بە فڕۆکە وهەواپەیمانە جەنگییەکان.

سەرەڕای پەرتەوازەیی وبێ تاقەت بوونی ئەو خەڵکەو وکەمی پێداویستییەکانیش وزەحمەتی گەیاندنی کۆمەك بە خەڵکی حەلەب، چ خەڵکی عام وچ موجاهیدەکان .. ئەمریکا وڕووسیا وئێران وهێزەکانی ڕژێمی سووریا ومیلیشیا ڕق لە دڵە تایەفەگەرەکان حەلەبیان لەسەر قومێك ئاو قووت نەدا، بەڵکو حەلەب دڕکێك بوو لە گەردنیان کە وەخت بوو تاڵاوی شکان وڕووخانیان دەرخواردی هەموویاندات ودوو جار بەرگی زەلیلی وسەرشۆڕیان بەسەردا دا، بە شکاندنی هێز وشەوکەتیان وبە شکاندنی گەمارۆ وحیساری سەر شارەکە.

مەجالم پێ بدەن ئەوەتان پێ بڵێم: کە ئەگەر تەواوی خەڵکی حەلەب بە شەهیدی یا بە زیندانی لەو شەڕەدا دەرچووبانە نە کەمکار بوون لە ئەرکیاندا ونە شکستیش بوو بۆیان،

لە ساڵی ٦٧ دا كۆمەڵی لەشكر وهێزەكانی جەمال عبد الناصر وحافظ الأسد لە چەند كاتژمێرێكدا بەرامبەر سوپای سەهیۆنیدا ڕووخان، دەی كە هێشتا خەڵكی حەلەب پێیان قایمەو دوژمنانیان داوایان لێ دەكەن بە ئارامی وبە چەكی سووكی خۆیان لە شارەكە بێنە دەرەوە دەبێ قسەمان چی بێ ؟

حەلەب بەو هەڵوێستەی تێیدا وەستایەوە پەیامێكی بە هێزی بۆ ئەو دەروون ڕووخاوانە نارد؛ كە سەریان بۆ كۆمەڵگای نێودەوڵەتی غەدر وگەندەڵی نواندووەو جورئەتیان نییە بە ڕووی ڕژێمە بەكرێگیراو وجاشەكانیان بوەستنەوە كە: سەركەوتن ئەستەم نییە وئەكرێ بەدی بێت، بۆ هەر كەسێك پشت بە خوای پەروەردگار ببەستێت وشەرەفی هەوڵ دان بۆ ئەو سەركەوتنە هەڵگرێ.

بەڵێ .. ئەمڕۆ ئەوان تەنها بە شكاندنی ڕۆحیەت وبڵاوكردنەوەی ڕۆحی داكەوتن لە نێوماندا سەردەكەون، هیچی تر نا .. چونكە زۆربەی سەركردەكانیشمان بەداخەوە سەرشۆڕ وزەلیل ولاواز ژیاون، تاوەكو زەلیلی تێكەڵ بە ناخیان بووەو بۆتە بەشێكی پێكهاتەیان، كە چیتر ناتوانن خۆیانی لێ دەربازكەن !

حەلەب بە تەنیا شەڕی خۆی بەڕێوەبرد، كەچی پێویست بوو لە هەمان كاتدا ئاگری شەڕ لە دیمەشق وقاهیرە وبەغدا وبەیروت وسەنعاء وتونس وجەزائیر وریباط داگیرسابا، لە پێناو ئازادی ورزگاریدا، بەڵام ئەو پایتەختانە حەلەبیان تەنها جێ هێڵا، كەچی حەلەب بە درێژایی هەموو ئەو ساڵانە خۆڕاگر وئارام مایەوە، دەی كەواتە ئەگەر هاوڕێكانی بەشداری ئەو شەڕەی بووبان ؟ بێ گومان زیاتر خۆی ڕائەگرت، بەڵكو ئەگەری هەبوو سەركەوێت وبەڵكو هەموویان سەركەون، بە ڕەچاوی ئەوەی توانای دوژمنان لە شەڕی فرە سەنگەردا پەرت دەبێت وبە تەواوی ئەو وڵاتانەدا بڵاو دەبێتەوە.

گەورەترین هەستی نێو دڵم بەرامبەر بەرهەمەكانی شەڕەكەی حەلەب، كاریگەرییەتی لەسەر ئەو نەوەی وا خەریكە دێت، كاتێك كە شەڕەكەیان بە چاوی خۆیان بینی، چۆن ئاستە یەكەمەكانی تێدەپەڕێنێت وزۆر بوێرانە خۆی لە بەرامبەر ئاستی كۆتایی زۆر قورس دا ڕادەگرێ، ئەو نەوەیە زیاتر لە مانای هەوڵ دان وگرتنەبەری هۆكارەكانی بەردەست دەگات؛ لەگەڵ پشت بەستنی تەواوەوە بە خوای پەروەردگار، جورئەت وبوێری بەرامبەر هێزەكانی خراپە وتاواندا لە جورئەتی ئەمڕۆ زۆر زیاتر دەبێ، ئەو هێزانەی خەریك بوون بە موسوڵمانان بڵێن: "أَنَا رَبُّكُمُ الأَعْلى" - ئێمە خوداوەندی بەرزی ئێوەین !! ئەو نەوەیە دڵنیای ئەوە ئەبێ كە هۆكاری دواكەوتنی سەركەوتن بێ توانایی نییە، بەڵكو قبووڵ نەكردنی بەشداری كردنە لەو شەڕەدا لە لایەن پێشڕەو وسەركردەكانیانەوە.

باش لەو ئایەتە دەگەن كە خوای پەروەردگار دەفەرموێت؛ "ادْخُلُوا عَلَيْهِمُ الْبَابَ فَإِذَا دَخَلْتُمُوهُ فَإِنَّكُمْ غَالِبُونَ ۚ وَعَلَى اللَّهِ فَتَوَكَّلُوا إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ" - لە دەروازەی شارەوە بچنە سەریان وهەر كە داخڵ بوون وچوونە ژوورەوە، ئەوە بێگومان ئیتر ئێوە سەركەوتوون، بە تەواویی پشت بە خوا ببەستن ئەگەر ئێوە ئیماندارن - .. بۆیان دەردەكەوێ كە پەیمانەكانی سەركەوتن وتەمكین لە قورئاندا تەنها كۆمەڵە دەقێك نین لەسەر مینبەر ولە دانیشتنەكاندا بۆ بەرز كردنەوەی ورەی خەڵك بخوێنرێنەوە ودووپات بكرێنەوە، بەڵكو هاتنە دییان حەقیقەت وڕاستییەكی حاشا هەڵنەگرە لای هەر كەسێ بە حەق هەڵیانگرێت وبە جدی وڕاستییەوە كاریان بۆ بكات، متمانەیان بە نزیك بوونەوەی ئەو ڕۆژە دەبێ كە پڕ بە دەمیان هاواركەن وبڵێن: "جَاءَ الحَقُّ وَزَهَقَ البَاطِلُ إِنَّ البَاطِلَ كَانَ زَهُوقا" - تازە حەق و ڕاستی هاتووەو بەرپا بووەو بەتاڵ و ناحەقی، پووچ و تەفرو توونا بووە، بەڕاستی ناحەق و بەتاڵ هەرتیاچووەو جێگیر نەبووەو بەزیووە.

فێری فیقهی جیهاد وحوكمەكانی دەبن ودەزانن كە ئەو جیهادە فەرزی ئوممەتە وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێت: "كُتِبَ عَلَيْكُمُ القِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَكُمْ" – شەڕ كردنتان لەسەر نووسراوە، ئەگەر چی شتێكە كە پێتان ناخۆشە - .. مانای ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەریان هەردەم لە یادا دەمێنیٚ كە دەفەرموێت "ما تَرَكَ قومٌ الجِهادَ إلّا ذلوا" - هەر قەومێك دەستبەرداری جیهاد بن وتەركی كەن زەلیل وسەرشۆڕ دەبن - كە دەفەرموێت؛ "إِذَا تَبَايَعْتُمْ بِالْعِينَةِ، وَأَخَذْتُمْ أَذْنَابَ الْبَقَرِ، وَرَضِيتُمْ بِالزَّرْعِ، وَتَرَكْتُمْ الْجِهَادَ، سَلَّطَ اللَّهُ عَلَيْكُمْ ذُلًّا لَا يَنْزِعُهُ حَتَّى تَرْجِعُوا إِلَى دِينِكُم" - گەر كاروبار ومامەڵەتان بە سوو و"ریبا"ــوە كرد وكلكی مانگاتان گرتە دەست ودڵتان پاڵی بە كشتوكاڵ وزیراعەت (واتا دونیا) دایەوەو، پشتان لە جیهاد كرد و وازتان لێی هێنا .. خوای پەروەردگار زەلیلی وسەرشۆڕییەكی واتان تووش دەكا، تا ئەو كاتەی دەگەڕێنەوە سەر دینەكەی خۆتان - .. جیهادی ئیسلامی لە بیرۆكەیەكی ڕەهای گروپ وبزووتنەوەیەك، دەبێتە حاڵەت وكلتوورێكی عام وگشتی لە دڵ ودەروونی ڕۆڵەكانی ئەم ئوممەتەدا.

من لێرەدا ناڵێم ئێمە قۆناغی ڕووخانی تەواومان بەرەو قۆناغی سەركەوتن وسەرفرازییەوە بەڕیٚ كرد، بەڵام لە حاڵەتی تەسلیم بوون وڕووخانەوە بەرەو حاڵەتی بەرگری وڕووبە ڕوو بوونەوەدا پەڕینەوە، لەوانەیە ئەم حاڵەتەش تا ڕادەیەك درێژە بكێشێت وماوەیەكی بویٚ تێپەڕی كەین، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئاوڕی دواوە نەدەینەوەو قوربانییەكان نەمانوەستێنن؛ گرنگ نییە چەند بن وچەند گەورە بن، لەم قۆناغەدا زانیمان واقیعمان چییە وچیمان لەبەر دەستەو دەبیٚ چی بكەین وئەركی سەرشانمان چییە، گرنگترینیشی لە تێڕوانینی مندا هاوسەنگی وتێك كردنەوەی هەوڵە بانگخوازی وسیاسی وسەربازییەكانە لەگەڵ یەكدا وهەوڵەكان تەواوكەری یەكتر بن، ئەوەیە كە هەر یەك لەمانە بە تەنیا ناتوانن سەركەوتن ورزگاری بە دی بێنن.

سەربازەكان كە خاوەنی خەبات وشەڕی چەكدارین پێشەنگی فیداكاری ئوممەتن، سیاسەتمەدارانیش لە پشتەوە ڕێڕەوە سەربازییەكانیان ئاراستە دەكەن وبە پێی بەردەست وتواناوە دەیجوولێننەوە، بەڵام نایانوەستێنن ولە كاریان ناخەن، هەروەها بانگخوازان وزانایان گەنجان هان دەدەنو ورەیان بەرز دەكەنەوەو تواناكان دەخەنە گەڕ، بۆ ئەوەی كۆمەكی تەواو بە هەموو شێوەو شێوازەكانیەوە بە موجاهیدان بگاتو، بۆ ئەوەی نەوە یەك لە دوای یەكەكان لە شەڕەكە دانەبڕێن ودوژمن ئەو ڕاستییە بزانێ كە هەر شەهیدێك بڕوات هەزار سەربازی تازەی بە دوادا دێتو، خوێنی شەهیدان بە هەدەر ناچێت، بەڵكو ئەو بانگەیە كە خەڵك ڕووی تێدەكەن وتۆڵەی دەسەننەوە وحەقی زەوتكراوی دەگەڕێننەوە.

بۆیە لێرەدا پڕ بە دەم دەڵێم: شەڕی حەلەب نە شكان ونە ڕووخانە، فەزڵی ئەوەش تەنها فەزڵ وگەورەیی ومنەتی خوای پەروەردگارەو پاشان خەڵكی حەلەب وموجاهیدە قارەمانەكانییەتی، كە چەندەها سەركەوتنیان تێدا بە دی هێنا، هەموو ئەوەش - بە ئیزنی خوای پەروەردگار - دەبێتە مەشخەڵێك بۆ ئەو كۆمەڵەی وا لەسەر ڕێن تاوەكو شەڕەكە بەردەوام بێت وتەواوی حەلەب ئازادكرێت وپاشان حەما وحیمص ودەرعا ودیمەشق وگشت بستێكی خاكی شامی خۆشەویستو، ببێتە خاڵی دەستپێكی ئازادكردنی وڵاتانی تری عەرەبی وئیسلامیمان، "وَيَقُولُونَ مَتَى هُوَ ؟ قُلْ عَسَى أَنْ يَكُونَ قَرِيبا" - دەشڵێن ئەوە كەیە ؟ بڵێ دوور نییەو لەوانەیە نزیك بێت.



**پێگەی ئیسلامی گزنگ**

Facebook:- @Gizing.net

Telegram:- @GizingNet

١٤٣٨ - ٢٠١٦